'Yes!' cried Mary. 'I think he will too. I'll tell him about our garden. I don't think he'll tell anybody.'

The two children worked in the garden all morning. Then Mary went into the house for lunch.

'Colin wants to see you,' Martha told her.

'I'll see him later this afternoon,' answered Mary.

'He'll be angry with you,' Martha said.

But Mary ran outside. 'Dickon's waiting for me,' she cried.

It was early evening when she came back inside. Martha did not look happy. 'Colin's very angry because you didn't go to see him,' she said.

Mary felt cross. She liked Colin, but he was not as important as the garden or Dickon. But she went to see him.

He was in bed. 'Why didn't you come?' he asked.

'I was in the garden with Dickon,' Mary said coldly.

'That boy isn't going to come here again,' Colin said angrily.

'Then I won't come here again!' Mary cried.

'Oh yes, you will!'

'No, I won't!'

'You unkind girl! I'm ill and I'm going to die!'

'No, you're not!' cried Mary.

Colin sat up when he heard that. 'You know I am!' he cried.

'No you're not, you stupid boy!' shouted Mary.

Colin threw a book at her. 'Get out of here!' he cried.

Now Mary felt really angry. 'I'm going and I'm not coming back!' she cried.

She ran out of the room. When she got back to her bedroom, she found some books on the table. They were from Mr Craven. There were some picture books and two books about gardens.

'That's kind of Mr Craven,' she thought. 'He remembered me.' She suddenly felt happy. Then she remembered Colin. 'He thinks he's going to be a hunchback,' she thought. 'He's very unhappy. Perhaps I *will* go and see him tomorrow.'

ماری زۆر هیلاك بوو . بۆیە زوو چوو بۆ نووستن ، بەلاّم لە نیوە شەو دا لەخەوهستا ووتی:
_ ئەو دەنگە دەنگە چی یە ؟ پاشان تێ گەشت :
_ ئەوە کۆلینە بەڕاستی بە دەنگی بەرز دەگری . ماری هەستی بە تووڕە بوون کرد لە دڵی خۆیدا گووتی : _ کەس ناتوانێت بیوەستێنێ ؟ مارسا هاتە ژوورەکەیەوە هاواری کرد .
_ نۆو ماری ئەوە کۆلینە کەس ناتوانێت هیچی لەگەڵدا بکات . تۆی خۆش دەوێ ئەتوانیت بێت قسەی لەگەڵدا بکەیت؟
ماری ڕای کرد بۆ ژوورەکەی کۆلین . دەرگاکەی کردەوە و ڕای کرد بۆلای جێگەی نوستنەکە . هاواری کرد
_ بوەستە ! ڕقم لێتە! بۆچی نامریت ؟ تۆ شتێکی گەمژەیت !
_ ناتوانم بووەستم ! ناتوانم !
ماری هاواری کرد :
_ بەڵێ ناتوانیت بووەستیت .
_ من پشت کۆم دەردەچم . من دەزانم هەست بە پشتم دەکەم و جیاوازە .
_ گەمژە مەبە ! پشانمی بدە .
_ زۆر چاکە دەبینێ !
پشتی پیشانی ماری دا . کچەکە بەووریایەوە سەیری کرد . پشتی زەعیف و لاواز بوو ، بەلاّم هیچ نەبوو . ماری بەدەنگێکی بەرز ووتی :
_ تۆ پشت کۆم نابیت . پشتی تۆ هەروەك پشتی من باشە. کۆلین بە لاوازییەوە پێکەنی.
_ بەڕاست ؟ بەڕاست زۆر باشە ؟
بەڵێ کۆلین ڕووی کردە مارسا لێ ی پرسی :
_ تۆ پێت وایە _ بژیم ؟
_ بەڵێ . بەلاّم پێویستە بچیتە دەرەوە و ڕابکەیت و یاری بکەیت ، کۆلین . پاشان باش دەبیت. کوڕەکە بەهێمنی یەوە ووتی :
_ کەواتە لەگەڵ ماری دەچمە دەرەوە . یەکسەر هەستی بەخۆشحاڵی کرد .
_من زۆر باشم ! من زۆر باشم ! ماری پێ ووت:
_ ئێستا بنوو . حەزدەکەیت گۆرانیت بۆ بڵێم .
بەڵێ .
ماری دەستی گرت و گۆرانی بۆ گووت . کۆلین نووست .

She was tired, so she went to bed early. But in the middle of the night, she woke up. 'What's that noise?' she thought. Then she understood. 'It's Colin. He's crying really loudly.' She felt angry. 'Can't somebody stop him?' she thought.

Martha came into her room. 'Oh Mary!' she cried. 'It's Colin. Nobody can do anything with him. He likes you. Can you come and talk to him?'

Mary ran to Colin's room. She opened the door and ran to the bed. 'Stop it!' she shouted. 'I hate you! Everybody hates you! Why don't you die, you stupid thing!'

'I can't stop!' Colin cried. 'I can't!'

'Yes, you can,' shouted Mary.

'I'm going to be a hunchback!' Colin cried. 'I know I am! I felt my back and it's different.'

'Don't be stupid! Show it to me.'

'All right. You'll see!' Colin cried. He showed Mary his back. The girl looked at it carefully. His back was thin and weak but there was nothing wrong with it.

'You're not going to be a hunchback,' said Mary loudly. 'Your back is as good as mine.'

Colin smiled weakly. 'Really? Is it really all right?'

'Yes!'

Colin turned to Martha. 'Do you think I'll live?' he asked.

'Yes!' said Martha. 'But you have to go outside. You have to run and play, Colin. Then you'll be fine.'

'Then I'll go with Mary,' the boy said quietly. He felt happy suddenly. 'I'm all right!' he thought. 'I'm all right!'

'Now sleep,' said Mary. 'Would you like me to sing to you?'

'Yes,' he said.

Mary took his hand and sang to him. Colin slept.

## 12 ( ماری نهێنی یەکە بە کۆلین دەڵێت )

سبەی بەیانی کەماری لە خەوو هەستا ڕۆژێکی خۆش بوو . وویستی بچێتە دەرەوە ، بەڵام چوو بۆ ژوورەکەی کۆلین . ووتی :

_ هاتیت !

کۆلین زۆر هیلاك دیاربوو.ماری دانیشت و هەردوکیان باسی دیکۆن و گیاندارو باڵندەکانیان کرد.کۆلین لێی پرسی :-

_ بەراستی دیکۆن دەتوانێ لەگەڵ گیاندارەکاندا قسە بکات.

_ پێم وایە دەتوانێ.ئەو دەڵێ هەموکەس دەتوانێ بەڵام پێویستە سەرەتا ببێت بە هاوڕێ لەگەڵ گیاندارەکاندا.

_ حەز دەکەم هاوڕێم هەبێت،بەڵام خەلکم خۆش ناوێت.

_ تۆ منت خۆش ناوێت؟

_ بەڵێ خۆشم ناوێیت.

بێن و بێزەر ستاف ئەڵێ کە من و ئەو لەیەك دەچین ،ئێمە زۆر لەگەڵ خەلکیدا روخۆش نین،ڕەنگە تۆش وابیت.ماری بۆ خولەکێك بیری کردەوە ووتی:-

_ئێستا من روخۆ[illegible]م.کۆلین بە هێمنیەوە ووتی:-

_ماری من دوێنێ زۆر بێ بەزەی بووم لەگەل دیکۆن و داوای لێبوردن ئەکەم ڕقم لێی بوو لەبەر ئەوەی تۆ خۆشت ویست .بەڵام من هەڵە بووم ،دەمەوێ چاوم پێی بکەوێت .

_باشە، لەبەر ئەوەی ئەو دەیەوێت چاوی بە تۆ بکەوێت ، ڕەنگە بتوانێ بێت و سبەینێ چاوی پێت بکەوێت. ماری دەستی کۆلینی گرت و لە سەرخۆ پێ ووت : _

_ کۆلین بەنیاز[illegible]نی یەکت پێ بڵێم . تکایە بەکەس مەڵێ .

_ نا نا ، بەکەس [illegible]ڵێم . ماری بەهێمنی ووتی :

_ گوێ بگرە . دەرگای باخچەنهێنی یەکەم دۆزی یەوە _ هەروەها کلیلەکەشم دۆزیەوە .

_ ئۆو ماری ! ئەتوانم بیبینم ؟ دەمبەیت بۆ ئەوێ ؟

_ بەڵێ . دیکۆن پاڵ بەکورسیە کەتەوە دەنێت .

ماری بۆ کاتێکی درێژ باسی باخچە هنهێنی یەکەی بۆ کرد . دوای ئەو ڕۆژە دکتۆرەکەی کۆلین لەگەڵ خاتوو میدلۆکدا سەردانیان کرد . پێ ی ووت :

_ تۆ دوێنێ شەو ئەخۆش بوویت کوڕی خۆم .

_ بەڵێ ، بەڵام ئێستا باشترم . بەنیازم بچم بۆ دەرەوە و باخچەکان ببینم .

## Chapter 12 Mary Tells Colin the Secret

It was a lovely day when Mary woke the next morning. She wanted to go outside, but she went to Colin's room.

'You came!' he cried. He looked very tired. Mary sat down and they talked about Dickon and his animals and birds.

'Can Dickon really talk to animals?' Colin asked.

'*I* think he can,' Mary answered. 'He says everybody can. But you have to be friends with the animals first.'

'I'd like to have friends,' Colin said sadly. 'But I don't like people.'

'Don't you like me?' Mary asked him.

'Yes, I do,' Colin answered.

'Ben Weatherstaff says that he and I are the same. We're not very nice to people. Perhaps you're the same,' said Mary. She thought for a minute. 'But I think I'm nicer now.'

'Mary,' Colin said quietly, 'I was unkind about Dickon yesterday and I'm sorry. I hated him because you liked him. But I was wrong. I want to meet him.'

'Good,' Mary answered, 'because he wants to meet you. Perhaps he can come and see you tomorrow.' She took Colin's hands. 'Colin,' she said slowly, 'I'm going to tell you a secret. Please don't tell anybody.'

'No, no, I won't,' Colin answered.

'Listen. I found the door to the secret garden – and I found the key too,' Mary said quietly.

'Oh Mary! Can I see it? Will you take me there?'

'Yes,' answered Mary. 'And Dickon will push your wheelchair.' She talked to him about the secret garden for a long time.

Later that day, Colin's doctor visited him with Mrs Medlock. 'So you were ill last night, my boy,' he said.

'Yes, but I'm better now,' Colin answered. 'I'm going to go outside and see the gardens.'

دکتۆرەکە دڵخۆش دیار نەبوو ووتی :

_ ووریابە .

_ ماری بەنیازە لەگەڵمدا بێت و دیکۆن پاڵ بە کورسیە پێچکەدارەکەمەوە دەنێت .

_ نۆو دیکۆن . لەگەڵ دیکۆندا باش بە . لەگەڵ خاتوو میدلۆک ژوورەکەی بە جێ هێشت .

خاتوو میدلۆک بە دکتۆرەکەی ووت:

_ ( سۆزان ساوەربی ) م بینی . دایکی مارسا هەفتەی رابردوو . باسی ماری و کۆلینم بۆ کرد و سۆزان ووتی : _ منداڵەکان پێویستە لەگەڵ منداڵەکانی تر دابن . ماری بۆ کۆلین باش دەبێ . رەنگە راست بکات .

_ بەڵێ ،رەنگە راست بکات . ئەو شەوە کۆلین بەباشی نووست . سبەی بەیانی ماری رایکرد بۆ ژوورەکە بە سەر سورمانەوە هاواری کرد :

_ دیکۆن دێت !

دەرگاکە کرایەوە و دیکۆن هاتە ژوورەوە باڵندەیەک لەسەر قۆڵی بوو . کۆلین دەمی داچەقاند: ئەوە لەسەر قۆڵی من دادەنیشێت ؟ دیکۆن پێکەنی ووتی :

_ تۆ پێویستە ببیت بەهاوڕی لەگەڵیدا . هەردوو کوڕەکە بە درێژایی ئەو بەیانییە قسەیان کرد. سەیری وێنەی ڕووەك و گوڵەکانیان کرد. دیکۆن ووتی:

_ئەم گوڵانەلە باخچە نهێنی یەکەدان. ئەمانەش .

_ بەنیازم بیان بینم . دیکۆن پێکەنی .

13 ( کۆلین باخچە نهێنی یەکە دەبینێ )

ڕۆژی دوای تر خۆر هەتاو بوو ، گەرم بوو . کۆلین قسەی بۆ خاتوو میدلۆک کرد :

_ من دەچمە دەر     نامەێت کەس لە باخچەکاندا ببینم .

_ بەڵێ گەورەم .

خزمەتکارێك کۆلینی برد بۆ قاتی خوارەوە و لەسەر کورسیە پێچکە دارەکەی داینا لە دەرەوەی خانوەکە .

کۆلین پێ ی ووت:

_ئێستا دەتوانیت بڕۆیت .

خزمەتکارەکە گەڕایەوە بۆ ژوورەوە . دیکۆن پاڵی بە کورسیەکەوە ناو ماری بە دوایاندا ڕۆشت . کەسیان لە باخچەکاندا نەدی . بەڵام پێش ئەوەی بچن بۆ ناو باخچە نهێنی یەکە ، ماوەیەکی زۆر پیاسەیان کرد . ماری ووتی :

The doctor did not look happy. 'Be careful,' he said.

'Mary's going to come with me,' said Colin. 'And Dickon will push my wheelchair.'

'Oh, Dickon!' said the doctor. 'You'll be all right with Dickon.'

He left the room with Mrs Medlock. 'I saw Susan Sowerby, Dickon's mother, last week,' Mrs Medlock said. 'I told her about Mary and Colin. Susan said, "Children have to be with other children. Mary will be good for Colin." Perhaps she's right.'

'Yes, perhaps she is right,' said the doctor.

Colin slept well that night. The next morning Mary ran into the room. 'Dickon's coming!' she cried excitedly.

The door opened and Dickon came in. There was a bird on his arm. Colin's mouth fell open.

'Will it sit on my arm?' cried Colin.

Dickon laughed. 'You have to be friends with it,' he said.

The two boys talked all morning. They looked at pictures of plants and flowers.

'These flowers are in the secret garden,' Dickon said. 'And these.'

'I'm going to see them!' cried Colin. Dickon smiled.

## Chapter 13 Colin Sees the Secret Garden

The next day was sunny and warm. Colin spoke to Mrs Medlock. 'I'm going outside. I don't want to see anybody in the gardens.'

'Yes, sir,' Mrs Medlock answered.

A servant carried Colin downstairs and put him in his wheelchair outside the house.

'You can go now,' Colin said.

The servant went back inside. Dickon pushed Colin's wheelchair, and Mary walked next to them. They saw nobody in the gardens. But they walked round for a long time before they went into the secret garden.

_ ئەمە _ ئەمە دەرگاکەیە ! دیکۆن بە خێرایی پاڵ بە کورسیەکەوە بنێ بۆ ژوورەوە !
لە ناو باخچەکەدا کۆلین چاوی گێڕاو بۆ چەند خولەکێك هیچی نە گووت .
ئێستا هەموو شتەکان سەوزن و لەهەموو لایەکیەوە گوڵی لێ بوو . خۆرەکە لەسەر دەم و
چاوە باریکەکەی کۆلین زۆر گەرم بوو . هاواری کرد :
_ ئۆو . جوانە ! باشتر دەبم ! ئەو پاش نیوەڕۆیە کۆلین پێ کەنی و قسەی کرد . هەستی
بە باشتر بوون دەکرد . دیکۆن و ماری بە خاکەنازەکانیان کاریان دەکرد و کۆلین لە
ژێرداریکی میوەدا دانیشت بوو لەسەر کورسیە پێچەکەدارەکەی . لەناکاو کۆلین ووتی :
_ئەو دارەی ئەوێ زۆر داریکی بەتەمەنە .
دیکۆن بەهێمنی یەوە ووتی :
_ بەڵێ . نەیوویست باسی بکات . لەناکاو بولبولەکە هەڵفڕی بۆ ناو باخچەکە . دیکۆن
هاواری کرد:
_ سەیرکەن بولبولەکە لەوێیە.
_ لەکوێ‌کۆلین سەری هەڵبڕی و باڵندەکەی بەدی کرد. پاشان دەستی کرد بە پێکەنین
درەختەکەی لەبیر چوەوە. ماری سەیری بولبولەکەی کردو بیری کەوتەوە:
_جادوو لەم باخچەیەدا هەیە . ئەزانم لێ یەتی . جادووەکە بولبولەکەی نارد . کۆلین
ئێستا بیرلە دارەکە ناکاتەوە . کۆلین ووتی :
_ بەنیازم هەموو ڕۆژێك بێم بۆ ئێرە .
دیکۆن ووتی :
_ بەڵێ ، تۆ قاچت هەیە ، پێویستە بە هێز تریان بکەیت . کۆلین پێکەنی ، ماری
بیریکردەوە :
_ پێم وایە دیکون جادوو دەکات . بەنیازم جادوو لە کۆلین بکات و کۆلین باشتر دەبێت .
نزیکی ئێوارە بوو باخچەکە هێمن و بێ دەنگ بوو لە ناکاو کۆلین هاواری کرد :
_ ئەو پیاوە کێ یە ؟
ماری و دیکۆن ئاوڕیان دایەوە بین ویزەر ستافی لێ بوو . سەریان لەسەر دیوارەکەوە بەدی
کرد پیاوە پیرەکە زۆر توڕە دیار بوو. نەیتوانی کۆلین و دیکۆن بەدی بکات ، تەنها ماری .
قیژاندی: _ چۆن هاتیتە ناو باخچەکەوە ، تۆ کچێکی خراپی ؟
_ بولبولەکە دەرگاکەی پیشاندام . کۆلین بە دیکۆنی ووت :
_ بم بە بۆ ئەوێ.

'This – this is the door! Push the wheelchair inside quickly, Dickon!' Mary cried.

Inside the garden, Colin looked round and said nothing for some minutes. Everything was green now and there were flowers everywhere. The sun was warm on Colin's thin face. 'Oh,' he cried, 'it's beautiful! I'm going to get well!'

That afternoon, Colin laughed and talked. He began to feel better. Dickon and Mary worked with their spades, and Colin sat under a fruit tree in his wheelchair.

'That's a very old tree over there,' Colin said suddenly.

'Yes,' said Dickon quietly. He did not want to talk about it. Suddenly the robin flew into the garden. 'Look, there's the robin!' Dickon cried.

'Where?' asked Colin. He looked up and saw the little bird. Then he laughed and forgot about the tree.

Mary looked at the robin and thought, 'There's magic in this garden. I know there is. The magic sent the robin. Colin won't think about the tree now.'

'I'm going to come here every day,' Colin said.

'Yes,' said Dickon. 'In a short time, you'll walk and use a spade too.'

'Walk!' said Colin. 'Use a spade! Will I?'

'Yes,' said Dickon. 'You've got legs. You have to make them strong.'

Colin smiled. Mary thought, 'I think Dickon makes magic. He's going to make magic for Colin, and Colin will get better.'

It was nearly evening and the garden was very quiet. Suddenly Colin cried, 'Who's that man?'

Mary and Dickon turned round and there was Ben Weatherstaff. They could see his head over the top of the wall. The old man looked very angry. He could not see Colin and Dickon, only Mary.

'How did you get into the garden, you bad girl?' he shouted.

'The robin showed me the door,' Mary answered.

'Take me there,' Colin said to Dickon.

دیکۆن کورسیە پێچکە دارەکەی نزیکتر خستەوە لە بین . کاتێك کەبین کۆلینی بینی دەمی
کرایەوە . کۆلین لێ ی پرسی :
_ من دەناسیت ؟ بین بە هواشی وەلامی دایەوە :
_ بەلێ تۆ کوری بەرێز ( کرافیت ) یت ، چۆن هاتیتە ئێرە ؟ تۆ پشت کۆمیت !
کۆلین بەدەنگێکی بەرز ووتی : _ من پشت کۆم نیم ! ماری قیژاندی :
_ نەخێر ئەو پشت کۆم نی یە . من پشتی ئەوم بینی و زۆر باشە .
کۆلین بە دیکۆنی ووت :
_ یارمەتیم بدە ئەمەوێت هەستم . دیکۆن قۆلی گرت و کورەکە لەسەر خۆ هەستایە
سەرپێ . زەعیف دیاربوو ، بەلام زۆر درێژ ووتی :
_ ئێستا _ سەیرم بکە بین ! من پشت کۆمم ؟
بۆ خولەکێك بین نەیتوانی قسە بکات پاشان ووتی :
_ نەخێر ، تۆ پشت کۆم نیت ، تۆ زۆر زەعیفیت ، بەلام تۆ باشیت .
کۆلین هاواری کرد :
_ وەرە بۆ ناو باخەکە . ماری دەرگاکەی کردەوە . بین لەسەر دیوارەکە دابەزی . کۆلین
ووتی : _ دیکۆن ئەمەوێت بچمە سەر ئەو دارە .
بەدەستی قۆلی دیکۆنی گرت و لەسەر خۆ چووە سەردارەکە . کەبین لە دەرگاکە هاتە
ژوورەوە کۆلین ووتی :
_ سەیرکە ! من پشت کۆمم ؟
_ نەخێر تۆ پشت کۆم نیت .
_ گوێ بگرە ! ئەم باخچەیە نهێنی یە . لای کەس باسی مەکە . تۆ دەتوانی هەندی کات
بێیت و یارمەتیمان بدەیت . _ سوپاست ئەکەم . بین پێ کەنی .
## 14 ( جادووەکە لە باخچەکەدا )
کاتێ کە کۆلین گەڕایەوە بۆ خانووەکە . دکتۆرەکەی سەردانی کرد پێ ی ووت :
_ ماوەیەکی زۆریشە لە دەرەوەیت .
_ بەلام من هیلاك نیم . من هەست بە باشتر بوون ئەکەم و سبەینێ بەنیازم هەموو
رۆژەکە لە دەرەوە بمێنمەوە .
دکتۆرەکە ئەمەی پێ باش نە بوو ، پاشان ژوورەکەی بەجێ هێشت . ماری ووتی :
_ئۆو تۆ زۆر لە گەڵ دکتۆرەکەتدا باش نیت .

Dickon pushed the wheelchair nearer Ben Weatherstaff. When Ben saw Colin, his mouth fell open.

'Do you know me?' Colin asked him.

'Yes, you're Mr Craven's son,' Ben answered slowly. 'How did you get in here? You're a hunchback!'

'I'm not a hunchback!' Colin said loudly.

'No, he's not!' Mary shouted. 'I saw his back and it's fine.'

'Help me, I want to stand,' Colin said to Dickon. Dickon took Colin's arm, and slowly the boy stood up. He looked thin but very tall. 'Now – look at me, Ben Weatherstaff!' he cried. 'Am I a hunchback?'

For a minute Ben could not speak. Then he said, 'No, you're not a hunchback. You're very thin, but you're fine.'

'Come into the garden,' Colin cried. 'Mary will open the door.'

'Yes, sir,' said Ben, and he climbed down from the wall.

'Dickon!' Colin said, 'I'm going to walk to that tree.' With his hand on Dickon's arm, the boy walked slowly to the tree. When Ben came through the door, Colin cried, 'Look! Am I a hunchback?'

'No, you're not,' the old man said again.

'Listen!' the boy said. 'This garden's a secret. Don't tell anybody about it. You can come sometimes and help.'

'Thank you,' Ben Weatherstaff said, and he smiled.

## Chapter 14 The Magic in the Garden

When Colin went back into the house, his doctor visited him. 'You were outside too long,' he said.

'But I'm not tired,' answered Colin. 'I feel better and tomorrow I'm going to stay outside all day.'

The doctor did not look happy about this.

After he left the room, Mary said, 'You aren't very nice to your doctor.'

کۆلین بیری لەمە کردەوە . ووتی :
_ تۆ ڕاست دەکەیت . من زۆر بێ بەزەیم لەگەڵ خەلکدا . هەوڵ دەدەم باشتر بم .
_ باشە . باخچەکە یارمەتیت نەدات . پێم وایە جادوو لە باخچەکەدایە . تۆ خۆشحاڵ دەبیت لەوێ و فێر دەبیت دڵسۆز بیت .
ئەو بەهاروو هاوینە بە ڕاستی جادوو لە باخچەکەدا بو . زۆر زۆر جوان گەشەی دەکرد . گوڵی ڕەنگاو ڕەنگی تیا بوو هەروەها گوڵە باخەکانیش بەهەموولایەکدا سەر کەوتبوون .
بێن بە کۆلینی ووت :
_ دایکت ئەو گولانەی خۆش دەویست .
منالەکان هەموو ڕۆژێك بە زوویی دەچوون بۆ باخچەکە . دیکۆن هەمیشە گیاندار و بالندەکانی دەهێنا و منالەکان یاریان لەگەڵدا دەکردن . کۆلین بەهێز تر و دڵخۆش تر دەبوو . ڕۆژێکیان خاکەنازێکی هەڵگرت و دەستی کرد بو کێلان . تەنها بۆ پێنج خوولەك کاری دەکرد ، بەلام هەریەك لە ڕۆژەکانی تر ماوەیەکی درێژ تر کاری دەکرد . پاش نیومڕۆیەك بە ناو باخچەکەدا دەگەڕا دیکۆن و ماری لە پێشیەوە دەڕۆشتن و بولبولەکە لەسەر دارێك گۆرانی دەگووت .
کۆلین هاواری کرد
_ جادووەکە بەهێزترم دەکات . بەنیاز نیم بە دکتۆرەکەم لێم ، کاتێك پێ ی دەلێم بەڕاستی بتوانم بە باشی ڕابکەم و کەباوکم هاتەوە دەچم بۆ ژوورەکەی ، دەلێم :
_ ئەوەتا من ، من زۆر باشم و دەبم بە پیاوێکی دڵخۆش و بەهێز .
ماری پێ کەنی و هاواری کرد : _ ناتوانم چاوەڕوان بکەم !
تەنها کێشەیە[illegible]وو . لەبەر ئەوەی کۆلین هەمیشە لە دەردوە بوو ، هەمیشە برسی بوو. بەماری گوت :
_ ئێستا زۆر دەخۆم . خزمەتکارەکان دەزانن من باشتر دەبم .
دیکۆن باسی باخچە نهێنی یەکە و کۆلینی بۆ دایکی کرد . دایکی زۆر خۆشحاڵ بوو پرسیارێکی زۆری کرد . دیکۆن باسی کێشەی کۆلینی لەگەڵ خۆراکدا بۆ کرد .

Colin thought about this. 'You're right,' he said. 'I can be very unkind to people. I'll try to be nicer.'

'Good,' said Mary. 'The garden will help you. I think there's magic in the garden. You'll be happy there and you'll learn to be kind.'



That spring and summer there really was magic in the garden. It grew more and more beautiful. There were flowers of all colours and the roses climbed everywhere.

'Your mother loved those flowers,' Ben Wetherstaff told Colin.

The children went to the garden nearly every day. Dickon often brought his animals and birds, and the children played with them. Colin grew stronger and happier. One day he took a spade and he started to dig. He only worked for five minutes. But each day he worked for a longer time. One afternoon he walked round the garden. Dickon and Mary walked next to him and the robin sang in a tree.

'The magic is making me strong!' Colin cried. 'I'm not going to tell the doctor,' he said. 'I'll only tell him when I can run really well. And when my father comes home, I'll walk into his room. I'll say, "Here I am. I'm very well and I'm going to be a strong, happy man."'

Mary laughed. 'I can't wait!' she cried.

There was only one problem. Because Colin was often outside, he was always hungry.

'I'm eating more now,' he told Mary. 'The servants will know I'm getting better.'



Dickon told his mother about the secret garden and Colin. She was very interested and asked a lot of questions. He told her about Colin's problem with food.

خاتوو ساوەربی پێکەنی ووتی :

_ بیرۆکەیەکم هەیە ، کۆلین و ماری دەتوانن یارمەتیم بدەن ، ئەو کات خواردنت دەدەمێ بۆ ئەوان .بیرۆکەیەکی سەرسووڕهێنەربوو . ڕۆژانی تر دیکۆن بە سەموون و کێك و شیرەوە دەهات خواردنەکە باش بوو هەموویان دەخوارد . دوای ئەوە کۆلین نە یدەویست خواردنزۆر بخوات لە خانووەکە . دکتۆرەکەی ئەی دەتوانی تێ بگات لەوەبە خاتوو میدلۆکی گووت :

_ سەیرە ، کوڕەکە خواردن ناخوات ، بەلام قەلەوتر دەبێ! پاشان بە کۆلینی ووت :

_ تۆ زۆر بەهێزتر دیاریت . باوکت زۆر خۆشحاڵ دەبێ کاتێك کە گوێی لەمە بێت .

_ نا ، پێ ی مەڵێ ! جارێکی تر نەخۆش دەکەومەوە ! دەست بەجێ دکتۆرەکە ووتی :

_ زۆر چاکە ئێمە پێ نالێین .

کاتێك کە بەجێ ی هێشت ، کۆلین سەیری وێنەکەی دایکی کرد . بە ماری ووت :

_ پێشتر هەرگیز ئەم دەوویست سەیری وێنەکەی بکەم ، بەلام ئێستا حەز دەکەم ، وابزانم دەیەوێت من دڵخۆش بم. ماری سەیری وێنەکەی کردو ووتی :

_ بەڵێ وابزانم دەیەوێت دڵخۆش بێت .

بەیانییەکیان هەرسێ منالەکە و بێن لە باخچە نهێنی یەکە دا بوون . لە ناکاو دەرگاکە کرایەوە . ژنێکی خۆش لەوێ وەستابوو پێکەنی بۆ منالەکان . کۆلین ووتی :

_ئەوە کێ یە ؟ دیکۆن بەسەر چیمەنەکەدا ڕای کرد و هاواری کرد :

_ ئەوە دایەیە ! تۆ ویستت چاوت پێ بکەوێت ، لە بەر ئەوە باسی باخچە نهێنی یەکەم بۆ کرد . کۆلین چووەلای خاتوو ساوەربی ووتی :

_ چۆنیت خاتوو ساوەربی ؟

چاوەکانی کۆلین گەورە بوون لە ڕووخساریدا .

_ ئۆو کوڕی نازیز :

_ تۆ پێت وایە باوکم منی خۆش بووێت ؟ من ئێستا بەهێز ترو باشترم ، بەلام ڕەنگە منی خۆش نەوێت .

_ بێ گومان . ڕووی کردە ماری و پێ ی ووت :

_ تۆ کچێکی جوانیت ماری .

ماری پێکەنی منالەکان خاتوو ساوەبیان بەناو باخچەکەدا گێڕا . کۆلین و ماری دایکی دیکۆنیان نەدەناسی ، بەلام خۆشیان دەویست. خواردنی پێ بوو.

Mrs Sowerby laughed. 'I've got an idea,' she said. 'Colin and Mary can give me money. Then I'll give you food for them.'

It was a wonderful idea. Each day Dickon came with bread, cake and milk. The food was good and they all ate it. After that, Colin did not want to eat much in the house.

His doctor could not understand it. 'It's strange,' he said to Mrs Medlock. 'The boy isn't eating, but he's getting fatter!'

'You're looking much stronger', he said to Colin. 'Your father will be very happy when he hears about this,' said the doctor.

'No, don't tell him!' cried Colin. 'I'll get ill again!'

'All right,' said the doctor quickly. 'We won't tell him.'

When he left, Colin looked at the picture of his mother.

'I never wanted to look at her picture before,' he told Mary. 'But now I like it. I think she wants me to be happy.'

Mary looked at the picture. 'Yes, I think she does.'



The three children and Ben were in the secret garden one morning, when suddenly the door opened. A woman with a very kind face stood there. She smiled at the children.

'Who is it?' Colin cried.

Dickon ran across the grass.

'It's mother!' he shouted. 'You wanted to meet her, so I told her about the secret garden.'

Colin went to Mrs Sowerby. 'Hello, Mrs Sowerby,' he said. His eyes were very big in his face.

'Oh, dear boy!' Mrs Sowerby said.

'Do you think my father will like me?' Colin asked her. 'I'm strong and well now, but perhaps he won't like me.'

'Of course he will,' Mrs Sowerby answered. She turned to Mary. 'You're a pretty girl, Mary,' she said. Mary laughed.

The children took Mrs Sowerby round the garden. Colin and Mary did not know Dickon's mother, but they loved her. She had

له ژێر دارەکاندا دانیشتن و خواردیان . منداڵەکان باسی جادووەکەیان بۆ کرد لە ناو باخچەکەدا .

_ بێ گومان لێرە جادووی لێیە ، بەڵام ناوێکی جیاوازم پێ یە بۆ ئەمە . بۆمن ، ئەوەیە گیا و دار و گوڵەکانن .شتە سەوزەکان _ ژیانە !

لە کۆتایی بەیانی یەکی خۆشدا . کۆلین بە هێمنی یەوە ووتی :

_ تۆ پێت وایە کەی باوکم دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە ، خاتوو ساوەربی ؟

پێم وانیە زۆر بخایەنێت ،کۆلین .

کۆلین بە چاوێکی پڕ خۆشەو ویستی یەوە سەیری کرد پێی ووت :

_ حەز دەکەم تۆ ببیت بە دایکی من .

خاتوو ساوەربی لە باوەشی کرد و ووتی :

_ دایکت لێرەیە . من دەزانم و باوکت دەگەڕێتەوە بۆلات .

15 ( لە باخچە کەدا )

کاتێک کە تۆ بیر لە دڵتەنگی یان شتە بێ یەزمیەیی یەکان دەکەیتەوە ، بۆ تۆ خراپە . لە هندستان ماری خەڵکی خۆش نەدەویست _ هیچ شتێکی خۆش نەدەویست ! بۆیە نەخۆش و بێتاقە بوو . پاشان هات بۆ ( یۆرک شیر ) . لەوێ بیری لە باخچە نهێنی یەکان و بولبولەکە و دیکۆن و زەلکاوەکە دەکردەوە . ئێستا کچێکی جوان بوو . ڕوخۆش تر و دڵ خۆش تربوو .

کۆلین بە هەمان شێوە بوو . پێش ئەوەی چاوی بەماری بکەوێت ، تەنها بیری لە پشتی دەکردەوە .

بەڵام ئێستا ب ...اورێ نوێ کانی و باخچە نهێنی یەکە دەکاتەوە ، هەروەها بیر لە شتە خۆشەکان دەداتەوە . بۆیە کەسێکی دڵخۆش بوو .

باوکی کۆلین ( ئارچیباڵد کرافیت ) بە درێژایی بەهار و هاوین لەماڵ نە بوو . سەردانی جوانترین شوێنی کرد لە ئەورووپا . هیچ کاتێک یارمەتی نەدا . تەنها بیری لە ژنە مردووەکەی دەکردەوە .

ڕۆژێکیان لە دەشتەکانی نووسترالیا بوو . هیلاک بوو و لەسەر چیمەنەکە دانیشت . لە هەموولایەکیەوە گوڵی لێ بوو و زۆر هێمن و بێ دەنگ بوو . بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ لە گوڵەکان ڕاما هەموو شتەکان هێمن ترو هێمن تر بوو . بیری کردەوە :

_ شتێکم بە سەر دێت . چی یە؟ هەست نەکەم _ هەست نەکەم جارێکی تر دڵخۆشم !

food. They sat down under the trees and ate. The children told her about the magic in the garden.

'Of course there's magic here,' said Mrs Sowerby. 'But I have a different name for it. For me, it's plants and trees and flowers. It's green things – it's life!'

At the end of a happy morning, Colin said quietly, 'When do you think my father will come home, Mrs Sowerby?'

'I don't think it will be long, Colin,' she answered.

Colin looked at her with love in his eyes. 'I'd like you to be my mother,' he said.

Mrs Sowerby took him in her arms. 'Your mother's here. I know she is,' she said. 'And your father will come back to you.'

## Chapter 15 In the Garden

When you think sad or unkind things, it is bad for you. In India, Mary did not like people – she did not like anything! So she was ill and cross. Then she came to Yorkshire. There she thought about secret gardens and robins, about Dickon and the moor. She was a pretty child now, and she was nicer and happier.

It was the same with Colin. Before he met Mary, he thought only about his back. But now he thought about his new friends and the secret garden. He thought about happy things and so he was a happy person.

Colin's father, Archibald Craven, was away all spring and summer. He visited the most beautiful places in Europe. Nothing helped him. He thought only of his dead wife.

One day, he was in the Austrian mountains. He was tired and he sat down on the grass. There were blue flowers everywhere and it was very quiet. He looked at the flowers for a long, long time. Everything got quieter and quieter. 'Something is happening to me,' he thought. 'What is it? I feel – I feel happy again!'

ئەو شەوە بۆ ماوەیەکی درێژ نووست لە خەویدا گوێ ی لەدەنگی ژنە مردوەکەی بوو دەیگووت : _ ئارچی ، ئارچی !
_ لە کوێی ئازیزەکەم ؟
کە بەیانی لە خەو هەستا ، ڕۆژێکی جوان بوو بیری دەکردەوە
_ لە باخچەکەدا . دەیگووت (( لە باخچەکەدا )) بەلآم من کلیلەکەم فڕێدا !
خزمەتکارێك هات نامەیەکی پێ بوو لە(( سۆزان ساوەربی ))یەوە هاتبوو نوسیبووی:
_تکایە وەرەوە بۆ مالەوە بەڕێز کرافیت.زۆر گرنگە خێزانەکەت حەزدەکات تۆ ئەگەڕێتەوە بۆمالەوە.بەڕێز کرافیت بە ووریایی یەوە نامەکەی خوێندەوە.
_دەگەڕێمەوە ئەمڕۆ ئێرە بە جێ دێلم.
لە گەشتەکە دا بەرەو یۆرك شیر بیری لە کۆلین دەکردەوە:
_ من باوکێکی خراپم . کوڕەکەم دەساڵ دەبێت ، بەلآم دەرەنگییشە؟ ئەتوانم یارمەتی بدەم ؟ کاتێك کە گەیشتە مالەوە خاتوو میدلۆك هات بۆ بینینی . یەکەم پرسیار ئەوە بوو : _ کۆلین چۆنە؟
بە هێواشی خاتوو میدلوك وەلآمی دایەوە :
_ ئەو ((( ئەو جێ ابازە ))) . زۆر سەیرە . قەڵەو ترە ، بەلآم خواردن زۆر ناخوات . بە کورسیەکەی هەموو ڕۆژێك دەچێتە دەرەوە بۆ ناو باخچەکان . خاتوو ماری وکوڕەکەی سۆزان ساوەربی دەبیەن .
_ ئێستا لە کوێ یە ؟
_ گەورەم لە باخچەکەدایە . ئەو هەمیشە لە باخچەکە دایە . خاتوو میدلۆك ژوورەکەی بەجێ هێشت و ... [illegible] کرافیت جارێکی تر و جارێکی تر ووشەکانی دووبارە کردەوە :
_ لە باخچە کە... ! چووە دەرەوە بۆ ناو باخچەکان و لەسەرخۆ بە ناویاندا پیاسەی کرد .
بیری کردەوە :
_ کلیلەکە لە کوێ یە . من فڕێم داوە . ئەتوانم دەرگاکە بدۆزمەوە ، بەلآم دەتوانم کلیلەکان بدۆزمەوە ؟ چووە لای دیواری باخچە نهێنی یەکەو دەرگاکەی دۆزیەوە . پاشان وەستاو گوێ ی گرت توانی گوێ ی لە دەنگە دەنگ بێت لە ناوباخچە کەدا ! بەلآم بۆچی ؟ کەس چووەتە ناو ئەم باخچەیەوە ! لەناکاو دەرگاکە کرایەوە و کوڕێك و کچێك ڕایان کردە دەرەوە . کوڕەکە زۆر بەخێرایی ڕای دەکرد بەڕێز کرافیتی بەدی نەکرد و ڕای کردە ژێر بالی یەوە .

That night, he slept for a long time. In his sleep, he heard his dead wife's voice. 'Archie, Archie!' she said.

'Where are you, my dear?' he asked.

'In the garden,' she answered, 'in the garden.'

When he woke the next morning, it was a beautiful day. 'In the garden,' he thought. 'She said, "In the garden." But I threw away the key!'

A servant came in with a letter. It was from Susan Sowerby. She wrote: 'Please come home, Mr Craven. It's very important. Your wife would like you to come home.'

Mr Craven read the letter carefully. 'I will go back,' he thought. 'I'll leave today.'

On the journey back to Yorkshire, he thought about Colin. 'I'm a bad father,' he thought. 'My son is ten years old. But is it too late? Can I help him?'

When he arrived at the house, Mrs Medlock came to see him. His first question was, 'How's Colin?'

'He's . . . he's different.' Mrs Medlock answered slowly. 'It's very strange. He's fatter, but he doesn't eat much. He goes out into the gardens every day in his chair. Miss Mary and Susan Sowerby's boy take him.'

'Where is he now?' Mr Craven asked.

'In the garden, sir. He's always in the garden.'

Mrs Medlock left the room and Mr Craven repeated the words again and again: 'In the garden!'

He went out into the gardens and walked slowly through them. 'Where's the key?' he thought. 'I threw it away. I can find the door, but can I find the key?'

He came to the secret garden wall and found the door. Then he stopped and listened. He could hear voices inside the garden! But why? Nobody went into this garden!

Suddenly the door opened and a boy and a girl ran out. The boy ran out very fast. He didn't see Mr Craven, and he ran into

بەڕێز کرافیت سەیری کرد . کوڕێکی بالآبەرزو قژی ڕەش و چاوەکانی گەورە و خوڵە مێشی بوون _ کێ _ چی_ کێ؟ کوڕەکە ووتی :
_ باوکە من کۆلینم .
بۆ خولەکێک باوکی نەیتوانی قسە بکات . پاشان بەهێمنی یەوە ووتی :
_ لە باخچەکەدا ، لە باخچەکەدا ! خێرا کۆلین ووتی :
_ بەڵێ من باشترم بەهۆی باخچەکەوە و هەروەها بەهۆی ماری و دیکۆن و جادووەکەوە . کەس نازانێ من باشترم . دەمەوێت تۆ یەکەم کەس بیت بزانیت . جارێکی تر بەڕێز کرافیت نەیتوانیەوە قسە بکات . کوڕەکەی دڵخۆش و باش بوو ! ئەمە باشترین شت بوو لە جیهاندا ! کۆلین هاواری کرد :
_ من باشم و دەژیم ، باوکە !
بەڕێز کرافیتقۆڵی کوڕەکەی گرت و پێ ووت :
_ بمبە بۆ ناو باخچەکە .
کۆلین بردی بۆ ناوی . ئێستا پایز بوو . هەموو لایەکەوە گوڵە پایزییەکانی لێ بوو . گوڵە باخەکان بە سەر دارەکاندا سەرکەوتبوون هەروەها بەسەر دیوارەکاندا . بەڕێز کرافیت هاواری :
_جوانە ! بەلآم بۆچی ؟ منیش دەساڵ لەمەوبەر باخچەکەم داخست . بۆچی شتەکان لە ناو نەچوون ؟
لەسەر چیمەنەکە دانیشتن و کۆلین باسی چیرۆکی باخچە نهێنیەکەی بۆکرد . باسی بولبولەکەو بێن و گیاندارەکان و جادووەکەی بۆ کرد پاشان ووتی :
_ نامەوێت لەو ... تر ببێت بەنهێنی . من هەرگیز جارێکی تر ناچمەوە ناو ئەو کورسیە پێچکەدارە لەگەڵ تۆدا دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە ، باوکە .
وای کرد . بێن ویزەرستاف لە پەنجەرەیەکدا بوو بانگی خزمەتکارەکانی تری کرد ووتی:
_ سەیرکەن ! ئەوە کێ یە بە چیمەنەکەدا دێت ؟
خزمەتکارە بۆ لای پەنجەرەکان ڕایان کرد . خاتوو میدلۆك دەستی ڕاوەشاند هاواری کرد:
_ ئۆ ! مەحاڵە ! کوڕێکی بالآ بەرزی بەهێز بەچیمەنەکەدا هات زەردەخەنە یەك بە ڕوخسارییەوە بوو ئەوە کۆلین کرافیت بوو !

کۆتایی

his arms. Mr Craven looked at him. He was a tall boy with dark hair and big, grey eyes.

'Who – what – who?' cried Mr Craven.

'Father, I'm Colin,' the boy said.

For a minute his father could not speak. Then he said quietly, 'In the garden, in the garden!'

'Yes,' Colin said quickly. 'I'm better because of the garden. And because of Mary and Dickon and the magic. Nobody knows I'm better. I wanted you to know first.'

Again, Mr Craven could not speak. His son was happy and well! This was the best thing in the world!

'I'm well and I'm going to live, father!' Colin cried.

Mr Craven took his son's arm. 'Take me into the garden,' he said.

So Colin took him in. It was autumn now, and there were autumn colours everywhere. Roses climbed over the trees and the walls.

'It's beautiful!' cried Mr Craven. 'But why? I shut the garden ten years ago. Why isn't everything dead?'

They sat down on the grass, and Colin told his father the story of the secret garden. He told him about the robin, Ben Weatherstaff, the animals and the magic. Then he said, 'I don't want it to be a secret any more. I'm never going to get into that chair again. I'll walk back to the house with you, father.'

And he did. Ben Weatherstaff was at a window and he called the other servants. 'Look!' he said. 'Who do you think is coming across the grass?'

The servants ran to the windows. Mrs Medlock threw up her hands. 'Oh!' she cried. 'It's not possible!'

A tall, strong boy came across the grass. There was a happy smile on his face. It was Colin Craven!